ناوی کتێب: وەرزێك لە تەنیایی

بابەت: شیعر

نووسەر: ئارام شوانی

کاری هونەری: عومەر سەیدە

ساڵی چاپ: ٢٠٠٧ چاپی یەکەم

ژمارەی سپاردن: (٥٥١)ی وەزارەتی رۆشنبیری ٢٠٠٧

## پێشکەشە بە:

* یەك دەریا لە میهرەبانی .. دایکم
* یەك هاوڕێ .. عومەر سەیدە
* یەك شاعیر .. محەمەد عومەر عوسمان (جەنەڕاڵی پایز)

# پێڕست

ڕەنگە ئەو بارانە نەهێڵێت چراکەم بسوتێت
بۆیە ئەمشەو گەر میهرەبانیتان بمبەخێشێت
دوعاکانتان ناخوێنمەوە ..
من حونجەی ئەم هەموو بێدەنگییەم پێ ناکرێت
قەسیدەیەکتان لە ڕەنگی تاریکی بۆ دەنووسم
ئاخر هێشتا لەجەنگی ئەم چاوەڕوانییە
نە ببووینەوە کەچی دێنو
کۆڵێك لە تەنیای لە کۆڵانەکەماندا دەڕێژن ..
ئای لەسەرمای ئەم ئێوارەیە
ڕوحم وێڵی دوای ئەو (گەڵا)یەیە
کە توڕەیی (پایز) لەباوەشی دایکی دزیوە



وەرزێک لە تەنیایی

دەمەوێ ئەمشەو بیکەمە ڕایەخی ژوورە چۆڵەکەم ..
سەفەرێکی چەند حەزینە هاوڕێ
کە ئێواران کۆڵانەکەمان بۆنی تەنیایی دەگرێت
من دوایین هەناسەمت بۆ جێدەهێڵم
خۆ ئەدرەسی مردن دەزانیت؟!!
ئێمە حەوسەڵەی ئەم چیرۆکانەمان نەما
ئیدی دۆڕانەکان جێدەهێڵین بۆ سەفەر ..
بیرتە دایکم دەیوت: بەیانییەك دەڕۆمو
شەقامێکی چۆڵت لادادەنێم
شۆستەیەکی هەتیوو پێکەنینێکی شەرمن شاهیدم بن

دەڕۆمو سۆراخیشم لە نێو پیرۆزی تابوتێکدا ون

دەکەم ..

بەر لەدەست پێکردنی ئەم جەنگە

سەربازێکی دۆڕاو .. لە بەرگی یەکەمی

کتێبی وەسیەتەکانیدا نووسیبوو:

" لەوێوە دێینەوە ..

ئەو کاتەی خەیاڵێك دەستی هەمووتانی گرتووەو

پێتان دەڵێت :" پێدەچێت ئەم ئێوارەیە

کەمێك زووتر خۆر جێمان بهێڵێت ..

چراکان کۆ بکەنەوە

ڕەشەبایەك میوانی ئەم نیشتمانەیە





ڕەنگە بیەوێت ڕوحی دوایین بەجێماوی خۆی

لە نێو توڕەییەکانی ئێمەدا دەربکات ..

ئەوکات ڕوناکیمان لەکێ بسێنین"؟!!

بەڵام حەیفێك هاوڕێ

کەسمان حونجەی ئەو وەسیەتەمان بۆ نەکرا ..

بۆیە ناتوانین گلەیی لە تاریکی ئەم ژوورە بکەین

کە سیمای یەکدی تیا ناناسینەوە ..

ئەوەتا (با)یەك دەیەوێ لە جێی هەمووومان بمرێت

ئاخر ئەو دەزانێ مردن وابەسانایی ئێرە جێناهێڵێو

کەسیشمان حەوسەڵەی سەفەرمان نییە بڕۆین

لەگەڵی ..

ئەو دەمرێت تا ئێرە نەبینێت کاتێ بێدەنگیمان

لە خەوێکی (مەنگ) ڕادەچڵەکێت ..

ئێمە ئەو بەیانییە بەنیازی گێڕانەوەی خەندەیەك

بووین

بۆ سەر لێوی وشك هەڵهاتووی دایکێك

دوور لەئێرە ..

دەچووینە قەراغ چەمەکانی نیشتمان

بەڵام ئەسەف .. ئەسەف هاوڕێ

ئەوێش خاڵی لە بۆنی ئومێدەکانی ئێمە ..

گەڕانەوەمان ناچارییەو

مەرگ لە ئێستا بێ ئەدرەستر نابێت



وەرزێک لە تەنیایی

ئاخر کۆتایی ئەم هەموو جەنگەمان بدەین بەکێ

خۆ هێشتا گەمەکانی منداڵیم نەدۆڕاندبوو

دوایین ئایەتی چاوەڕوانییمت خوێندەوەو

دەستەکانت بە بێدەنگی بێشکەیەك بەخشی ..

دەچمەوە ئەوێو فلوتێك بۆ حاڵی ئەم تەنیاییەم

دەژەنم

کە هاتمەوە مشتێك لە حەسرەتی سەفەرو

هێندەی ڕەنگی بیناییم غەریبیتان دەدەمێ ..

ئەو دەمەی ڕەشە(با)ی ئێوارەیەك

هەموو باخچەکانی نیشتمان دەشێوێنێت

بەردەرگاکەمان پڕ دەبێت لەتەرمی ئەو گەڵایانەی

بەر لە (پایز) خەونی فڕینیان دەبینی ..

بۆیە ئەم شەو گەر میهرەبانیتان بمبەخێشێت

دوعاکانتان ناخوێنمەوە ..

ئاخر من لە پیاسەی ئەم کۆڵانە دەترسمو

سیمای دایکیشم لێرە نابێتەوە ..

٢٠٠٦/١٠/٢٩



وەرزێک لە تەنیایی

دەمم پڕە لەتامی ئاشنایەتی

ئەسەف

ڕەنگم غەرقی غەریبییەکی قوڵە ..

نیوەڕۆیەك قەدەری بێدەنگی

ڕێگەم لێ ون دەکاو

وردە بەردی ئەم کۆڵانانەش

یاری بەتەوێڵم دەکەن ..

ببورە دایکە ..

ناگەمەوە لای تۆ

چەند دوورم لێتەوە

سەدەیەك دوورتر لە(ئەو) ..





لە مێرووەکانی قەد بێشکەکەی منداڵیم

کە نەتدەهێشت پڕ بەحەزی

ئەم سەرە بێسەودایەم

یارییان پێبکەم

نەبا دەنگە دەنگی شێتانەی من

باوکم لەخەوێکی قوڵ هەڵبسێنێت

ئاخر ئەو تورەیە لێمان ..

چاوەڕوانم بە ..

بەیانییەك دەگەڕێمەوەو

نازانم کاغەزەکەم بێنمەوە

کە سکێچی خوێنی شەهیدێکم تیادا نەخشاندووە ..

مندالّێك دەگری و

بیرم دەچێت من شاعیرم

گەلایەك وەریوەو

من بۆنی گوڵێك لوتی پڕ كردووم ..

لەبولێڵی بەیانییەكدا دەگەڕێمەوە

كە ئەدرەسی هەموو خانەقاكانی شارم لیّ وونبێت ..

دەچمە سەر بەردەنوێژێك و

دوعاكانی گەڕانەوەت بۆ دەخوێنم ..

شەوێك لەتەنیاییدا دمرمو

هاوڕێكەم گاڵتەم پێدەكات ..

یا ببورە ..



وەرزێک لە تەنیایی

چیرۆكەكان مەحزونترن لەمردنی من و

تورەیی ئەوان و بێباكی ئەم ..

بەیانییەك دەگەڕێمەوە

مشتێك لەخۆڵی ئەو بیابانە دەڕێژم

لەبەردەم كۆلانەكەماندا

كە عەیامێكە مندالّیمی تیادا وون بووە..

پەردە كوللەی سەر ماڵی خۆمان لادەدەم و

گویّ لەگریانەكانی براكەم دەگرم ..

بەیانییەك هێشتا دایكم

لەخوێندنەوەی وێردەكانی نەبووەتەوە ..

من بەلێدانی دەرگای (حەوشە) ڕایدەچڵەكێنم ..

باوکم لەبەر هەنسکەکانی ناپەرژێت

دەرگام لێبکاتەوە ..

دایکم نایەتو

دەست بەڕومەوە دەنێت ..

من دێمەوە

تا دوایین حەسرەتی خۆمو

هەواڵی سەفەری ئازیزانم

بۆ نیشتمان بێنمەوە ..

تائەم ئێوارەیە لێرەبم ..

لەتەنیشت هەناسەکانی دایکم

نزیك لەتوڕەیی باوکمەوە



وەرزێک لە تەنیایی

تورەکەیەکی لێوان لێو

لەیادگارییەکانی منداڵیم پێیە بۆ بەخشینەوەی ..

بەڵام ئەسەف کە ئێمە

هەموو بەردی نێو دارلاسیکی منداڵەکانمان کۆکردەوە

تاچۆلەکەکانی پێ نەترسێنین

کەچی هەر فێری نیشتنەوە نەبووین ..

ئەسەف .. هەموو گیرفانەکانمان

پڕکرد لە (قۆپیا) ..

چونکە نەمانتوانی سەعی بکەین

بۆ دۆزینەوەی ژەمێك لە پێکەنین ..

٢٠٠٦/٦/١١

لای هەموو ئێوارەیەك

خەیاڵم دەدەمە دەستی شەپۆلی دەریایەك

تا لایلایەی ئەم دایکە نەمگریەنێت

کە بۆ بێدەنگی منو

بەدبەختی کۆرپەکەی هاوارێتی ..

جۆلانەی من هەر تەنیایەو

"با"ی خەیاڵیش یاخییە لێم ..

دەڕۆمەوە لای گەورەییو ماڵئاوا ئەی منداڵیم ..

ئیدی گوێ لەموناجاتی ئەم زیکرەیشت ناگرم

تا حاڵی شیعرێکت نەمگریەنێت ..

دوعاخوازیت لێدەکەمو





نزایەك بۆ گەورەیی ئێستام دەڵێمەوە

پەشیمانم لەو گڕوگاڵانەی

کە بۆنی بەرائەتی تۆ

ئەی "منداڵی" .. پێمی دەکرد ..

بەرائەتی تۆ بەمن چی

کە نیشتمانم بۆنی مەرگی لێدەڕژێت ..

ئەوەتا کۆڵانەکەمان پڕ بووە لە وشەی بەجێماو

لە قەسیدەی هەتیو ..

لەڕەنگی ئەو فرمێسکانەی

کە مەحاڵە سیمای منداڵییم وون بکەن ..

ئیدی منیش گەورە دەبم

کێ خەم لەتەنیایی ئێوارەیەکم دەخوات

کە خەونەکانم دەداتە دەست تورەیی "با" یەك

تۆ ئەی "منداڵی" ..

ئەم قەسیدەیەیشت تەنیا خستم

ئەم تابلۆیەیشم بۆنی حوزنی لێدەڕژێت

ئیدی لە خەونێکیشدا دەستی تەنیایی بەرنادەم

تا فێری فڕینم نەکات ..

ئاخر تۆ لە ئاسمان دەفڕیتو

باڵی بچوکیم نامگەیەنێت بەتۆ ..

بەردەکانم فڕێ دەدەمو

خەیاڵی دۆزینەوەی دار لاسیکەکەیشم ناکەم





هەموو چۆلەکەکان سڵ لەمنداڵیم دەکەنەوە

دەچمەوە باوەشی گەورەیی‌و

ڕەنگە بەریئەکانی تۆیش فڕێدەدەم

"دوایین هەناری دوونیا"یشم ناوێت

ئاخر نەمدەزانی دەبێت شکستی هەموو پاڵەوانەکانی

لەسەر دەستی مندا دەبێت ..

زامی سەفەری (دایك)یشت بۆ سارێژ نەکردم

ئیدی ماڵئاوا ئەی منداڵیم ..

مردنیش نادۆزینەوە تا بەخەیاڵی گۆرانییەك

بچینەوە بۆ بەرپەنجەرەکەی ..

موعجیزەی ئەم چاوەڕوانیەشمان بەسەرچوو

هەموو قەسیدەکانم تەواوکرد

کەچی یەك دێرت لەلا جێنەهێشتم

سڵاو ئەی گەورەیی ئیدی لەلای تۆم ..

خۆ (شەو)م لە ئێستا تورەتر نابێت

دەستی تۆ دەگرمو

ئەدرەسی هەموو ڕوبارەکانیش دەزانین ..

ئیدی لەخەوی چاوەڕوانیشدا لەنامەکانت دەگەم

ئیدی هیچ شەوێك بەخەیاڵی شیعرێکەوە

سەرێکی تەنیایی شەقامەکان نادەم ..

ئاخر منیش گەورە بووم

ببورە ئەی منداڵی ..



وەرزێک لە تەنیایی

من دەڕۆم تا لەئێستا ناشیرینتر نەتبینم

ئەمە دوایین پێکەوەبوونمانە

تا بەخەیاڵی شیعرێك بفڕین ..

پینەی شڕی شەرواڵێکو لەتێ نانی ڕەقو

قومێ هەناسەی ساردت لامە

دەیدەمەوە بەخۆت

ئیدی منیش گەورە دەبمو

پێکەنینم بە منداڵی خۆمو

گەورەیی ئێستای تۆ دێت..

تۆ لەو فڕینە وەرە خوارێ

منیش دێم بۆ لای گەورەییت

تۆ لەو بەرزیەوە بۆ من مەڕوانە

وەرەو سەیرێکی گەورەبوونی من بکە

گەر منداڵیم نەبێت کێ ورك لە گەورەیی تۆ

دەگرێت؟!

ببورە منداڵی ئیدی بەجێتدەهێڵم

دەزانم هێشتا بەشێك لە گۆرانییەکانی تەنیاییمان

مابوو بیڵێینەوە

من دەچمەوە لای گەورەیی‌و

ئەوانیش لەگەڵ تۆدا ئەرشیف دەکەم.

٢٠٠٦/١٢/٢٢

بەر لەوەی دەفەکان شەهیدبن

ئێوارەیەکمان هەبوو تاحاڵی بێدەنگی تیا بگرین

هێشتا خانەقاکەمان پڕە لەو موریدانەی

کەسوێندی تەنیاییان خواردووە ..

هاوڕێ ..

کزەبایەك میوانی ئەم شارەیەو

جەستەی تەزاندوین ..

وەرە باڕوحمان لە سپێتی ئەو بەفرە هەڵکێشین

کە پێدەچێت دوایین بارینی بێت ..

ئەزیزم ئێستا زوو بوو بۆ ئەم بێدەنگییە ..

ئاوێنەکان پڕن لە دڵۆپی ئەو فرمێسکانەی



وەرزێک لە تەنیایی

بۆ بێکەسیت ڕشتبوون ..

ئێواران غەریبی ڕەنگت دەکەنو

بەیانیان لەتەنیایی من دەچنو

گەڵایەك هەواڵی گەڕانەوەت دەپرسێت ..

جارێ زوو بوو بۆ سەفەر

هێشتا دایکم لە سۆراخی مەعشوقەکەتدایەو

منیش مشتێ دوعام بۆ هەڵگرتویت ..

ئەدرەست لەکوێیە ئەزیزم ..

پەنجەکانم بابردویەتی پێنووسەکەم ناوێت

دوادێڕی ئەم قەسیدەیەشم پێ نانووسرێ

سەرم سەودای خەمێکی تولانییە ..

زەمەنێکە چاوبڕکێ لەگەڵ ئازارەکانمدا دەکەم

ئەرشیفێك لەخەم

ماڵێك لە دۆڕان

کێوێك لەئازار

نەخشەی دوایین وێستگەی بوونم بۆ دەکێشن ..

من بێدەنگو دایکیشم دەیوت:

ڕۆڵە .. ڕۆمانی ئەم گریانە بەکەس مەڵێ

کێ هەیە تەنیا یەك دێڕیت بۆ حونجە بکات ..

وەرەو گوێ بۆ نزا گریاوەکانی من بگرە ..

بیرت دێ باوکت دەیوت:

تۆ هەمیشە لەوانەی جوگرافیدا (سفر) دێنی



وەرزێک لە تەنیایی

چونکە نازانی نیشتمان چەند دەرگای هەیە ..

بۆیە لەگەڕانەوەتدا

ڕێگەی ماڵیشت لێ ون دەبێت ..

هاورێم سەفەر حیکمەتی گەورەییەو

تۆش بەشەکەتی ئەم هەناسانەوە

مەحاڵە بتوانیت زاکیرەیەکی خاڵی

"فێر بکەیت لەوێڕا چۆن بگەڕێتەوە" ..

کە من چاوەڕێی غروبی ئێوارەیەك بکەم

تازەنگی"دوایین سەفەر" ببیستم

ئیدی دێڕێکم نامێنێت بۆ وتن

لەفرمێسکی مەعشوقەکەت پیرۆزتر ..

ببورە ئەزیزم ..

مردن سوعبەتی پاشایەك نییە دوای گەڕانەوەی لە

جەنگ ..

پێکەنینت بە عەجولی من نەیەت

کە ئێوارەیەك وڕێنەکانم دەبیستیت ..

زەریاش بێڕەحمە لەمانای غەریبیت تێناگات

مشتێك ئاوی بەسە بۆ خنکاندن ..

بایی ژەمێك پێکەنین شك دەبەم

وەرە تابەشی لێو تەڕکردنێکت بدەمێ ..

وەرەو گوێیەك ببەخشە بەدوعای ئەو پەپولانەی

پێش هەڵقرچان بۆتیان دەکرد ..



وەرزێک لە تەنیایی

یا حەسرەتی ئەو منداڵەی

تەنها زمانێکی دەزانی بۆ پاڕانەوە

بەیانییەك چرپەی سەفەر

دوایین تەلیسمی چاوەڕوانی شکاند ..

بۆیە فریانەکەوت

وەسێتی ئەو قەرەجەت پێبڵێ

کە بەختی تۆی لەنێو لەپی ئەمدا خوێندبووە ..

دوایین هەناسەی بەهیوای گەڕانەوەت هەڵکێشا ..

زەمەنێك سوکناییت پێنەبەخشێ ..

گەر دوایین وەسێتت بیدەنگییە

ئیدی منیش

بۆ تەسبیحە وونبووەکەی نەنکم دەگەڕێم

تا تەهلیلەی ئەم تەنیاییەمی پیٚ ئەدا بکەم ..

پڕ بە دوو مشت دووعا دەکەمو

لێوێك شك نابەم فاتیحایەکی ڕەوانت بۆ بنێرم ..

بۆیە بەیانیانەکانم دابەشی (سفر) دەکەمو

نیوەڕۆیش شەڕێك لەگەڵ بەختی خۆمدا دەکەم ..

ئێوارەم دابەشی هیچ ناکەم ..

ئێوارەیەك بۆ بینینی دایکمو

ئێوارەیەك بۆ سەفەرو

ئێوارەیەك بۆ مەرگ ..

بەر لەوەی ئێوارەی سێیەم بێت





ئاوێنەکانی نیشتمان دەشکێنم

تا سوڵتان هەستی پێنەکات

ئاخر پریاسکەیەك لەوڕێنەکانی منداڵیم تیا

جێهێشتووە ..

٢٠٠٦/٦/٧

مەهێڵە ئەم قەسیدەیە تەواو بکەم

وەرەو یەکەم دێڕی تۆ بینووسە ..

وەرەو پێنووسەکەم لێ وەر بگرە

تا تابلۆیەکی دیکەی لەحوزن ڕەنگ ڕێژ نەکردووە ..

ئەم ئێوارەیە

تا خۆر دوایین نیگای لێنەکردوین

دەستی بگرە ..

بەرگەی تاریکی ئەم شەوە ناگرم ..

هاوڕێم وەرەو ئەدرەسی ڕوبارێك وەربگرە

تا غوسڵی دووڕوویی خۆمانی تیا دەربکەین ..

دەمێکە لەم جۆلانەی تەنیاییەدا





بای خەیاڵ ڕامدەژێنێ ..

چاوەڕێی لایلایەیەکی تۆم

تا خەوێك بەئاسودەیی خۆمەوە ببینم ..

مەحاڵە لێرە لەم وەنەوزی چاوەڕوانییەدا

هیچ لەدێڕی ئەو نامانەت بگەم ..

هاوڕێم ..

هەموو قەسیدەکانی ئێرە گەڕام

تەنها یەك دێڕ نەبوو بۆ مەرهەمی ئەو زامەی

سەفەری دایکم کردییە جەستەم ..

مەهێڵە چیدی گەورەبم

هۆ منداڵی دەستم بگرە ..

دەستم بگرەو بمبەرەوە بۆ ماڵی ئاشنایەتی ..

تا لەوێ لەبەر پەنجەرەی مردنا

گۆرانییەك بۆ بێهودەیی ژیانو

قەسیدەیەك بۆ ئەم موعجیزەی چاوەڕوانییە بڵێین ..

بەسیە ئیدی ئەوەندە دوعای دۆڕانمان کرد

ئێستا نزای پەشیمان بوونەوەم لێ وەرناگیرێت ..

بۆیە چاوەڕێی هاتنی تۆم

لەگەڵ " دواهەمین هەناری دونیا"دا ..

هەتا ڕەنگی ئەم غەریبیەم وندەکەم ..

٢٠٠٦/١/٣



وەرزێک لە تەنیایی

زەمەنێکە

لەنێو باخچەیەکی ئەم نیشتمانەدا

خەو بەهەڵهاتنی مانگەوە دەبینم ..

تا وشەکانی منالّیم بیرخاتەوە ..

هاورێم تۆ دەپرسی:

ئێرە مەملەکەتی لەسێدارەدانی خەونەکانە

یا قاموسێکە بۆ بینینەوەی حەزەکان ..

نا هاوڕێ ئێرە سەرابە سەراب ..

تا چاو بڕکا یەکدی وندەکەین و

بە دە سەڵاویش یەك نادۆزینەوە ..

ئەوەتا .. من زەمەنێکە





لەژێر تریفەی ئەم مانگە بێ شەوقەدا

بۆ پەیڤە وەریوەکانی

نێو نامەیەك دەگەڕێم

کەسیما بەریئەکانی منالّی پێمانی ڕژان ..

ئەوەتا لێرە دەستو دلّێکی نەدۆڕاو

تەفسیر بۆ خەونەکانمان دەکات ..

خەونێك پێش بینین

تەئویلەکەیمان پێبلّێن ..

بمبورە

کە بلّێم من لێرە خەو نابینم ..

چونکە ئێواران




بەئاگاییەوە خەوم لێدەکەوێ ..

کەواتە هاوڕێم..

ئەمە سەرابە سەراب ..

بۆیە پێت دەڵێم:

بمبوورە بۆ ئەو هەموو کاتەی

کە وەک گوڵێك لەنێوانماندا هەڵوەری ..

٢٠٠٣/٧/١٠





چاوێکم دەبەخشم بەتەنیایی ئەو شەقامەو

دەستێکم بەکردنەوەی دەرگایەکەوە تەزیوە ..

مەڕۆ هاوڕێ

گەر بایی ئینجانەیەك گوڵ شك دەبەیت ..

دوایین نیگاشت نەبەخشی بەمن

تەنها سەڵاوێکم بەسە ..

خۆ تۆ لەنهێنی ئەم بێڕەنگییەم دەگەیت ..

بمبەخشە هاوڕێ

دەکرێت تاڵێ لەڕوناکی ئەو چرایەم بدەیتێ؟!!

خۆ تۆ خەونێك نەماوە لەسایەیدا تەئویلی بکەیت

ئێوارەیەك نەماوە



وەرزێک لە تەنیایی

گوێ لەتەنیایی شەقامەکان بگریت ..

حیکایەتی شەوە درێژەکانیساڵت تەواو کرد ..

خۆ من وتم" ئاسەواری خاچەکان کۆ دەکەمەوە"

بەڵام دڵۆپی ئەو بارانە ناتبەخشێت

کە ئولفەتیان بەجەستەی تۆوە گرتبوو ..

بۆیە خەوی هەموو نیوە شەوەکانی خۆیان دەتۆران و

دەهاتنە بەرپەنجەرەکەت

تا تۆ هەست بەتەنیایی نەکەیت ..

ئەی ئەو گەڵا هەڵوەریوانەی

هەزار ڕازی خۆیان لادرکاندبوویت ..

تەنیا تۆ گوێت لەئازاری بەر بوونەوەیان دەبوو ..

منو ئەویش دڵ تەنگ بووین بەبانگی (سەفەر) ..

بەڵام مەسیح ناتبەخشێت (دە) خاچت دۆڕان ..

من دەتبەخشم

کە ئێوارەیەك لەگەڵ دوکەڵی جگەرەیەکدا

دەمدەیتە دەست تەنیایو

سەڵاوێکیشم بەبێدەنگی باڵندەیەکدا

بۆ نانێریتەوە ..

**٢٠٠٦/٥/١٣**

ببورە هاوڕێ ..

دۆڕان سەرەنجامی هەموو ئەو قومارانەمان بوو

کەلەگەڵ بەختی خۆماندا دەمانکرد

کەچی کەستان پێناسەیەکتان

پێنەبوو بۆ مەرگ ..

من دەڵێم ژیان پیرەژنێکی پیرەو

کەسێك نیە پێی بڵێت:"

لەبەر ئەم ئاوێنە تەڵخەی ڕۆژگاردا

بەسیە پرچی سپی نائومێدیت مەهۆنەوە" ..

گەر چاوەڕوانی هەواڵێکیت

ئەوە .. دیسان تەنیاییت شادو ئێوارەت پیرۆز ..



وەرزێک لە تەنیایی

هاوڕێم ..

وەرزێك بەنیازی فڕین دەستی مانگ بگرە ..

ئەم ماڵە جێگەی تۆ نیە..!

بەچاوی ئەمەل لەو پەنجەرانە مەڕوانە

غوباری بێ هیوایی بەری گرتون ..

لەنهێنی کردنەوەی دەرگایەك بگە!

بەسیەتی دانیشتن بەدیار چرا کوژاوەکانی دیدەتەوە

ئیدی .. ڕۆژە ڕەشەکانی عومرت مەنووسەوە ..

خۆ من .. بەبێدەنگیت تێدەگەم

دەتەوێ بڵێیت:

ئێوەو نیشتیمان درۆکانتان لەسەر لەپی دەستان

دەنووسن

تا لەگەڵ یەکەم تەوقەی دوڕوویيتانا کاڵبێتەوە

ئەریٚ بەڕاست .. ژیان چیە؟

ئەمە قسەی منالێك بوو

گڕوگاڵی یەکەم هەوڵی فێربوونی زمانی بوو ..

دایکم ووتی: ژیان قامچی دەستی جەللادێکە ..

مامۆستایەك ووتی: ژیان منالێکی عەجولە

بەسەد جار لێدان .."داراو دوودارەکەی" پیٚ لەبەر

ناکرێت ..

غەریبێك هاواری کرد .. نا

ژیان گۆڕستانێکی چۆڵە





کەس ماڵی بەختەوەری نازانێت

ئیدی لە ناسنامەی چی دەپرسن ..

ڕیشۆڵەیەك پڕ بەدەمی پێدەکەنی

دەیوت: ژیان لای من فڕینە بەسەر(با)دا ..

ئەوەتا بستیٚ خاك نیە هێلانەی تیابکەیت

لەترسی منالە دلڕەقەکانی شار ..

دە کەواتە "ببورن" ..

نامەوێت زمان بگرم ..

ئەمە دوادێڕی وەسێتی ئەو منالە بوو

کە پرسیاری لەجوانیەکانی ژیان دەکرد!

ئای پیاوە دلڕەشەکانی نیشتیمان

ئێوە درۆتان لەگەڵ یەکەم قەترەی شیردا

خواردووەتەوە ..

دەست لەنیەتی گەورەیتان هەڵگرن

بەسیە کوشتنی ئەم هەموو جوانیەی ژیان بەلاوی

ئیدی شەرم لەبۆنی درۆکانتان بکەن

کە منالێك تف لەبەرائەتی خۆی دەکات ..

کۆترێك نایەوێ بنیشێتەوە ..

چرایەك ڕوناکی خۆی بەکەس نابەخشێت ..

ئیدی بەس نیە دووڕوویی؟!!

دەروازەیەك بۆ هەناسەکانمان بهێڵنەوە ..

ڕێگامان بدەن ئاگرێك بەو مۆمەوە بنێین





تا تاریکی شەو نەیکوشتووین ..

ئێستا ئێوەش بمبورن شەقامە بێنازەکانی شار

بەقەد ڕەقی دڵی جەلادێك

پێ بەسەر سەرتاندا دەنێم ..

بمبورن شۆستەکانی شار

ناچارم شەوێك بتانکەمە سەرینی خەوێکی پڕ

لەدڵنیایی

ئاخر .. غەریبم

لێمگەڕێن تا هاواری منالێکی سەموون فرۆش

بەئاگام دێنێ لەیەکەم سەرنجماندا

هەردووکمان دەڵێین:"

هەست بەقورسی ژیان ناکەین

تانەیدەین بەکۆڵماندا "

دیسانەوە ئێوارەیەوماڵێکمان نییە لەشاردا

بۆنی غەریبی کەسێك نەکات ..

ئێوارەیەو ئەو ئەڵێت:

بمبورن عەزیزان

فریای وەسێتێك نەکەوتین

دڵۆپەی بارانێکی بەخوڕ

کاغەزەکەی بەردەستی تەڕکردم

بمبورن هاوڕێیانم ..

فریای خوێندنەوەی ئەو نامەیە نەکەوتم



وەرزێک لە تەنیایی

کە بەجەللادێکدا بۆتان ناردبووم ..

ڕەشەبایەکی سەرشێت هاتوو

گیرفانەکانی پڕ پڕ کردم لەبۆنی نائومێدی ..

ئاخ .. لەم بیابانی هاوڕێیەتییە

بەقەد بینینی چاوەکانمان .. یەکدی ووندەکەین

تادڵ حەز بکات تینومانەو

تاشەو حەز بکات دەخنکێین

تا پایز حەز بکات هەڵوەریوین ..

ئێستا دەپێم بڵێن کەشەو دێت جگە لەمانگ

کێ چیرۆك بۆ هەسارەکان دەگێڕێتەوە

کە گەورە دەبین جگە لەمەرگ ..

چ خەڵاتێك دەكرێین؟

ئەوەتا هێشتا وەنەوزی خەوێك نەیگرتبووین

كەچی تەئویلەكەیان پێ ووتین

عەسرێ .. پەڵە هەورێك

بەنیازی بارین هاتە ئاسمانی شار

دوای ڕوانینێك .. بەجێی هێشت

نامەیەكی بۆ منالێك جێهێشتبوو

تیایدا نووسیبووی:"

بێهودەیە بارین لێرە

بایی پاكبوونەوەی ڕووی كەسێكتان ناكەین" ..

ئێوە ڕقتان لەگیرفانەكانتاندا چاندووە





بایی بەرائەتی منالێك خەندەتان پێ نییە ..!

باسی پاكبوونەوە بۆ دەكەن ..!!

كەستان كلیلی ئەو دەرگایەتان پێیە

كە لێی نوسراوە"ڕاستگۆیی"؟

كەس ئەدرەسی ئەو ماڵەی پێیە

كەلێی نوسراوە"دڵنیایی"؟

باسی خۆشەویستی چی دەكەن ..

هێشتا ووسڵی پاكبوونەوەی ڕقتان لەزمانتان

دەرنەكردووە

كەچی نیازتانە وانەكانی بەرائەت بڵێنەوە ..

ئای هاوڕێم

ئێمە هێشتا تامی سوننەتەكانی ژیانمان نەكردبوو

كەچی ئەوان مارشی دابڕانیان پێ لەبەر دەكردین

" ئێرە ماڵی دابڕانە"

بۆیە ئێستا تك تك نائومێدیمان لێدەچۆڕێت

بەنیازی گەڕانەوەی چیت؟

خۆ ئێستا ڕێ نابەینەوە سەر شوێن پێیەكانی

خۆشمان ..!

لەبیرتە لەوێ .. سێبەری مەلێك چاوساغمان بوو

دەمێكە ئەویش نیشتمانی جێهێشتووە ..!

شار نامۆیە بە ئێمە

بڕۆ بەشوێن باڵندەیەكی كۆست كەوتوودا





بزانە دەتگەیەنێ بەكوێ ..

هاوڕێم ماڵی من بیابانەو (چیا)یەك بەسەریدا

دەڕوانێت

ئەویش وەكو من چاوەڕوانی هەورێكی سەرهەڵگرتووە

تا لە ئامێزیدا بنیشێتەوە ..

ڕەنگە ئەوە چاوساغەكەی شارمان بێت

كە لێمان وونبوو ..

ئۆف .. دایكە چۆن بوومە ئەو ڕەنگە ڕەشەی

هەموو ڕۆژێ دەڕژێمە چاوتەوە ..

لەڕونی نیوەڕۆكاندا بۆم مەگەڕێ

دەمێكە تاریكی شەو بردوومی ..!

بەیانییەك سەر بەگوێی هاوڕێكانمەوە بنێ

بەڵكو ناوی منیان بیستبێت ..

تكا بكە ..

بەئێوارەیەكدا ماڵی تۆم بۆ بهێننەوە ..

نا بمبورە هاوڕێم ..

ئێمە موسافیری ئەو نیشتمانەین

كە هێشتا دەرسەكانی

ئاشنایەتی تیایدا قاچاخە ..

لەدایك بووی ئەوماڵەین

وا پەنجەرەكانی بەسەر لوتكەی(چیا)یەكەوەیە

فڕین تیایدا شێتییە شێتی ..





ئاخ دایكە ڕەشپۆشەكەی مناڵیم

تەمەنناى گەورەیی كێی؟

ئاخر هەموو باڵدارێكی ئەم وڵاتە

بێباڵ كەوتوون ..!

چونكە جەرگی تۆ .. بەباڵی ئەوان فڕی

چاوەڕوانی گەڕانەوەی چی؟

لێرە تەپوتۆزی گەورەیی ئەوان ..

ڕێ بەبینینی گەورەییمان نادات ..

ئێستا هەموو ڕەنگەكانی ژیانیشمان لێ وونە

مەگەر مناڵیی دەستم بگرێو بمباتەوە ماڵی خۆمان

كە نازانم ڕێ بەگەورەیی من ئەدا

یا لەئەزەلەوە فاتیحای مەرگی بۆ داداوین ..!

ئەوەتا چاوەکانم

خاڵی لەبینینی کۆڵانە بەرینەکانی شار

بەر دەرگای هەمووتان پڕ بووە

لەتامی درۆکانتان ..

ئەی موسافیری وڵاتێك

کە پێی ئەلێن دووڕویی

درۆکانیشتان لێتان تێدەگەن

کە دەتانەوێت بڵێن:"

دوابڕیارمانە

کە کەستان





پاسپۆرتی گەڕانەوەی ئەو نیشتمانەتان نییە

بەمناڵی یەکدیتان تیاناسی

تف لەقەدەری گەورەبوونی خۆتان بکەن"..

ئای هاوڕێم

ئەم نیشتمانە بۆ بوو بەپەتی سێدارەو

ملی هاوڕێیەتیمان دەقرتێنێت ..

ئەمماڵە بۆ بوو بەگۆڕستانو

زیندووەکانیشی تیا دەنێژرێت

ئەم چاوە بۆ دوای کوێربوونیشی

هەر ڕەنگی من دەبینێت ..

ئەوەتا شار یەکپارچە سەهۆڵبەندانەو

بەسەد جار تیشکی خۆر گەرممان نابێتەوە ..

دە ئاگرێك بەو مۆمەوە بنێن

تا تاریکی زستان نەیکووشتوین ..

هاوڕێ دەپێم بڵێ من تێناگەم ..

تێناگەم ..

لەوەڕسبوونی من باکت نەبێت

ئاخر چەند وەرز بەدیار چرایەکی کزەوە

شەو تابەیان

پەڕە پەڕە لەهەڵوەرینی ڕۆحی خۆمو

باڵی پەپولەو وەرینی گەڵایەك دیقەتم داوە

چەند عەیام





بەدیار فڕینی ڕۆحی خۆمەوە

وەنەوز گرتومی ..

ئای هاوڕێم

چەند بێئاگابووین

ئەو دەمەی ئێمە ژێر چەتری مووحیبەت بۆ ژیان

دەگەڕاین

ئەو لەسەر باڵی پەڵەهەورێك سەفەری کردبوو

لەچاوەڕوانی گەڕانەوەیدا

تاڵە سپییەکانی عومری خۆمان دەنووسینەوە

ڕۆژە ڕەشەکانی بەختی ئەو

فرمێسکە گەشەکانی چاوی دایکم

گریانەکانی منالێك

توڕەبوونی باوکم

وەڕس بوونی هاوڕێکەم

لەپرسیارە بێماناکانی من

دواجار ئابڕووچوونمان

لەوەی کەناوی ژیانمان بیرچووەتەوە ..

ئاخر هاوڕێم

ڕۆژ نییە ڕێگایەکی دیکەی سەفەر نەناسین ..

شەو نییە

خەون بەئازارەکانی گەڕانەوەوە نەبینم

تۆ بڵێی نیشتمان ڕێ بە لەدایکبونەوەمان بدات





یا ئەویش دووبارە

تابووتی مەرگمانەو

بەچاوی گەرەبوون لێمان ناڕوانێت!

دەی نیشتمان

تەفسیری ئەم خەونانەم لەکێ بپرسم؟

کە ئێوارەیەك خۆر جێمدەهێڵێت ..

دادو واوەیلای سەرمابوونمان بۆ کوێ بەرین؟

کەشەوێ تاریکی

میوانێکی ڕەزا قورسی ماڵەکەم دەبێت

ناخی پڕاوی ئەم حەرفانەم لەبەر ڕوناکی چیدا

بدۆزمەوە؟




بەچی دڵی شکاوی ئەو پەپولانە بەمەوە

کە لەبێکەسیدا لەمنو

لەبێدەنگیدا لەتۆ دەچن ..؟

چۆن فەرمووی مانەوە لەو نەورەسانە بکەم

کە جگە لەئاسمان هیچماڵێکی دیکەیان نییە

جگە لەفڕین ئەدرەسێکی دیکەیان نیە ..

جگە لەمەرگیش

هیچ چارەنووسێکی دیکەیان نییە

کەسمان بەحونجەش

لە پەیامی ئەو مناڵە تێناگەین

کە چرکەی هاتنی بۆ ژیان






بە گریانەوە دەڵێت:"

ڕەنگەکانی ژیان لە نەبووندا جوانترە

تا لە بوون" ..

٢٠٠٥/٩/١٧

بایی ئەم ئێوارەیە هەناسەم بەرێ ئەی (مەرگ)

ژوانێکم لەگەڵ تەنیایی ئەو شەقامەدا هەیە..

دەمەوێت سکێچی منالێکی برسی بکێشم

کە توڕەیی (با)ی ئەم بەیانییە

دەستەکانی لێسەندووە

سەری نائومێدیی لەسەر ئەژنۆی وەڕس بوو ..

تەنها ئەم ئێوارەیەم دەوێ

لێم گەڕێ

دوایین خەوی پاڵ عەرەبانەیەك ببینم ئەم شەو ..

دیارە پیاسەی دوایین ئێوارەی شارمە ..

کە نائومێدی دەستم دەگرێو





دوو ڕکات نوێژی مەرگم پێ ئەدا ئەکات ..

ڕێگەم بدە ئەی مەرگ ..

دوایین ئێوارەی ژیانمە ..

بافریای نووسینەوەی

وەسێتنامەیەك بۆ نیشتمانو

ئەرشیفی دوایین یادگارییەکانی شارم بکەوم ..

ئەوسا ژیان پیرۆزی تۆ بێت ..

ئیدی وەڕس بووم لە نیگاکردن لەمانگ

ورشە ورشی ئەستێرەکان بێزاری کردووم ..

ئیدی چاوەڕێی کردنەوەی هیچ دەرگایەکیش نیم

پەنجەرەی هەموو ئومێدەکانیشم بۆ ئێوە ..

گریانەکانی دایکیشم

بۆ منداڵە چەتوونەکانی ماڵ جێدەهێڵم ..

دەچمەوە باوەشی ئازیزترین هاوڕێم ..

فاتیحای هیچ کەسیشم پێ ناگات ..

چونکە هەموو تەلْقینەکانتان بۆ من درۆ بوو ..

دەرگای هەموو ماڵەکانی شار

غەریبی ڕەنگم دەکەن ..

بەختم لە دوعای هیچ بەیانییەکی

نەنکمدا نەماوە ..

نیوەڕۆی هەموو دانیشتنەکانی ماڵی خۆشمان

خاڵییە لە ناوی من ..





بایی یەك ئێوارە ژیانم دەویٚ‌و

بایی یەك ئێوارە ڕوانین ..

دە ئەی مەرگ ڕێگەم بدە

دوایین هەناسەمت دەدەمیٚ ..

دایکە ..

دوایین گلەیی بێت

یەکەم دێڕی قەسیدەیەکت بۆ نەنووسیم ..

دوایین دێڕیشت دایە دەست فەنابوون ..

کەس نییە تەفسیری دوایین بێدەنگیتم بۆ بکات

ئیدی گویٚ لەدوایین گریانەکانیشت ناگرم ..

چونکە نازانم دوایین لایلایەت بۆ کیٚ دەبێت

دوایین فرمێسکی منیش

کەس ئەدرەسی نازانێت ..

مەرگ نەبێت بەکەس ئاشنانیم ..

فلْچەکەی دەستم

بایی یەك تابلۆ ڕەنگی پێنەماوە ..

سۆراخی ئەم بێدەنگییەم لەپای چی ..؟

ڕەنگی وەریوی هەموو گەڵاکان لەچاوم دایە ..

سەرمای هەموو شەوە درێژەکانی ساڵ دەستی

تەزواندووم ..

تەنها گوڵێکی ئەم بەهارە نەبوو

بۆنی ژیانی تیادابێت ..





گەرمی هەموو نیوەڕۆکانی ساڵ

ڕەنگیان بردووم ..

غەریبترم لەو باڵندەیەی

لە بێ لانەییدا ئێواران

بۆ دورترین چۆڵەوانی باڵەکانی لێکدەدات ..

دە ڕێگەم بدەن

دوایین سەفەرو دوایین ماڵئاواییمە ئەم ئێوارەیە ..

ئیدی بەخیلی بەبەرائەتی منالێك نابەم

کە بێدەنگی هەموو ڕۆژێك

کۆلارەکەی لێووندەکات ..

ئیدی گوێ بۆ نزا گریاوەکانی باوکیشم ناگرم ..

تەسبیحاتەکانی منالیشم لێرە جێ ناهێڵم ..

سەفەرەو بەرەو وڵاتی مەرگ دەڕۆم ..

زەمەن هاوکێشەیەکی چەند ئاڵۆزە

بەمن حەل ناکرێت هاوڕێ ..

ئەگەر جورئەتی پرسیارێك هەیە

ئەدرەسەکەم ڕێگەیەکی دوورە بەرەو گۆڕستان ..

دوایین فرمێسکمەو هەڵدەوەرێت ..

دوایین وەسێتمەو جێتان دەهێڵم ..

دوایین تەماشامەو کەس نابینم ..

کات زەمەنی شەوە

شار لەخەوێکی قوڵدایە ..





ئازیزترین هاوڕێی دەڕواو کەس پێی نازانێ ..

هەموو بایەقوشەکانی ئەم وڵاتە نەیانتوانی

بە سرودێکی شووم نەفخی دۆڕانم بۆ لێبدەن

ئێستا تەنیایی دەمبات بۆ ماڵی مردن

دوایین ئێوارەمەو دەڕۆم ..

گریانەکانتان بەرنەوە بۆ هەڕاجخانەی نیشتمان

من کڕیاری سەبەتەیەك مەرگم

ئیدی تەفسیری هیچ خەونێکم پێناکرێت ..

تیشکی خۆری هیچ بەیانییەك نامترسێنێت

بۆ ئاوابوونی هیچ غروبێکیش ناگرێم

دوایین ئیوارەو دوایین پیاسەی تەنیاییمە ..

ئەم بەیانییەش شوومترین وەرزی گەڵایەکە

کە ئیدی کەس نییە بۆ مەرگی بگریەت

دوایین فرمێسکم لە سەر دەستی ئەو جێدەهێڵم ..

دوایین نیگام لە تابلۆیەکی بێدەنگ دەچێت ..

کە ڕەنگەکانی لە توڕەیی باوکمو

گریانەکانی دایکم جێمابن ..

دوایین وەسێتم شوێن پێیەکمەو

لەسەر سینگی شەقامێکدا بەجێی دێڵم ..

هەناسەکانیشم دەدەم بەو منداڵەی

بایی نیوەڕۆیەك ئومێدی پێنەماوە

تافریای گێڕانەوەی



وەرزێک لە تەنیایی

مژدانەیەك بکەوێت بۆ دایکی ..

من بەهیوای تیشکی چرایەك بووم

تا ئێوارەیەك بۆ دۆزینەوەی خشڵەکانی بەدبەختیم

دایگیرسێنم ..

ئەسەف  لە دوایین قەدەری بێزاربوونیدا

بە ئیملایەکی سەقەت بۆی نووسی بووم:

"ببورە من چەند بەخشندەبم ڕەشەبا نایەڵێ

ڕوناکیمت بدەمێ"..

٢٠٠٦/٤/١٣

تۆ زاکیرەت پڕە لە ڕەنگی ونبوونو

بۆ کوخێکی نەگەڕاوە دەگەڕێیت

منیش ماڵێکت لە گۆرانی بۆ دروستدەکەم ..

ئەستەمە ئەم خەیاڵی فڕینەت

کە بە ئومێدی "مەرگ"ەوە دەتبات

ئەوەتا لە ئاسمانەکانی نیشتماندا ژیان دەبارێت

وادەی غروبێکی دیکە هات هاوڕێ

با چاوشارکێی نێو ئەم گۆڕستانە تەواو بکەین ..

چ شێتییەکی سەیرە ئەم ونبوونەت

ئەرێ تۆ عاشقی مردنێکی بەهار ئاسایت

یا جێماوی نێو قەسیدەکانی جەنگیت؟!





ئەو هەموو تاریکیە چیە

لە نێو حەوشەی مزگەوتەکەتاندا دەبارێت؟

بۆنم بە هەموو تابوتەکانی نیشتمانەوە کرد

لە تۆ غەریبتریان نەدەناسی

ئیدی کۆتایی ئەم چیرۆکانە لە کوێن؟

کە حەوسەڵەی پیاسەی نێو ئەم قەسیدانەت نەماوە

ئیدی گوێ لەم بێدەنگیانەیشم مەگرە

کە ئەسەری هەموو حیکایەتەکانمان

لە مەغریبێکدا بە جێهێشت ..

دەڕۆینو ئەدرەسی ئێرەیش وون دەکەین ..

گەر ڕێزی ئەم جەنگەیش نەگرین

گەڕانەوەمان یەکسان دەبێت بە (سفر) ..
ئەمە قەدەری چ جەنگێکە
کە سەرمان لە باوەشی(بەفر)ێك دەنات
چ جەنگێکە ئەم قەدەرە
بۆ بەمردنیش لێی تێناگەین ..
ئەو ڕۆژەی منداڵێك بە دایکی وت:"
نیشتمان بۆنی چ حوزنێکی گرتووە
تا چاو بڕکات لە تەنیایدا غەرق بووینو
ژیان لەسەر پشتی دەریایەك سەما دەکات" ..
ئێمە سەری ئەم بیابانەمان هێنایە ژان
ئەوەندە بە بەرائەتی ئەو منداڵە پێکەنین





ئیدی جەنگ ناکەین .. گریانەکانمان تەواو
ئیدی حوزنت لە بەرۆکی شیعرێك دەدەمو
وانەکانی پیرۆزییش لەم حوجرەیەدا دەخوێنین ..
بەر لەوەی حوزنی سەفەر تەواو بکەم
عەسرێك چیرۆکی هەموو شکستەکانت بۆ دەگێڕمەوە
ئێوارانیش پێش ئەوەی حیکایەتەکانی مردنمان
پێبگات
پەنجەرەیەکی دیکە
بەڕووی سەفەردا دادەخەینو
دەرگاکانی چاوەڕوانیشمان
دەخەینە سەرپشت ..

دەچینە حزوری هەموو سەرابەکانی نیشتمانو
هیچ گولێك بەشی بۆنکردنێکمان ناکات ..
ئاخر ئێمە لەم جەنگی "مەرگ"ە دەترساینو
فاتیحای چاوەڕوانیشمان پێ ئەدا ناکرێت ..
ئێواران ئەو دەمەی سەمای "بەفر"ێك
ڕۆحمان دەتەزێنێت
گەر شارێك هەبێت تەنیاییمان لێوەربگرێت
هەموو گۆرانیەکانی فڕینو تەواو دەکەینو
مردن دەدەینە دەست ئێوارەیەکی دیکە
تا ئەویش لە سەحرایەکدا
بۆ خەونێکی جۆلانەی پێبکات ..





بەر لەوەی مردن لەو خەونەی هەڵبسێت
ئێمە دەڕۆین ..
گەر باڵەکانمان ڕوخسەتمان بدات
لە سەحەرێکی پڕ لە قیندا دەگەڕێینەوەو
سەرێك بە ماڵە بێ ئەدرەسەکەی دایکماندا
دەکەینەوە ..
ئاخر ئێمە ئەو هەموو دەرگایانەمان پێ ناشکێنرێتو
شوشەی پەنجەرەکانیش لە ئێشتا ناسکتر نابن
با نەفخی دۆڕانێکی دیکە لێبدەین هاوڕێ ..
ئەم گۆڕستانەیش جێدەهێڵین
تا کێلی گۆڕەکانیش لێمان وەڕس نەبوون ..

ئای لەم ئازاری حوزنە ..

ئێمە سیمای مردووییەکمان گرتووە

کە دوای شکست وەسیەتەکانی بۆ خوێندینەوە ..

کە ئێمە لە یادەوەری هیچ سەرکردەیەکدا نەمابین

مانەوەمان بێماناترە لە چیرۆکەکانی (نەنک)م

بیرتە .. کە هەموو شەوێك مندالّیمی پێدەترساند؟

عومرێکی چەند تولانیە

چاوەڕوانی لە چاومدا ڕواوە

چاوەڕوانییەکی چەند تولانیە

کە ژیانمان لە سەحرایەکدا ونکردووە ..

ژیانێکی چەند هیچە



وەرزێک لە تەنیایی

کە سەرێك بە مالّی ئێمەدا ناکات ..

چی مالّێکی بێدەرگایە

بەس مردن وونمان دەکات ..

مردنێکی چەند عەجیبە

کە نایەلّێ یەك وەسیەتیش بەجێبهێلّین ..

غەریبێك لێرە خەون بە بەرائەتی منەوە دەبینێت

لە شەوی یەکەمیدا دەلّێت:

"گەر جلی سولّتان نەپۆشیت مەڕۆ

بردنەوەی ئەم جەنگەیش هێندە سانا نییە

دەست بەم تەنیاییەتەوە بگرە

بەشی هەموو عومرت خەیالّت دەداتێ" ..

ئەو هەموو بەیانیەك دێتو

تەئویلی دوایین خەونی خۆمم بۆ دەكات ..

بەیانییەك وتی:" گەر بەخشندەیی مردن نەبووایە

ئێرە دەبوو بە تابوتی قەرەجێك

عومری ئەو بەقوربانت

تەمەن شتێكە ملكەچین لە بەردەمیدا" ..

لەو ڕۆژەوە هەموو شەوێك

من خەون بەبارینی (بەفر)ەوە دەبینم

نیوەڕوانیش لە كوخە بێدەرگاكەی شاردا

دەستی تەزیوم بە سینگی خۆمەوە دەنێم ..





ئەویش دەڵێت:" بێدەنگ بە دڵم هێزیماڵئاوایی

نەماوە ..

دایكم هەموو ڕۆژێك

پێكەنینی بە گەمژەیی من دێت

من پێش ئەوەی خەونێك تەواو بكەم

ئەو كۆتا دێڕیم پێدەڵێت ..

من لە وەسیەتێكدا بۆم نووسیبوو:"

ئێواران "با"ی ئەجەلێك دێتە سەر حەوشەی

ماڵەكەمو

زاكیرەی پڕە لە ڕەنگی من ..

كەچی ئەو دەڵێ:

"بمبەخشە ئێمە حەوسەڵەی حەسرەتی ئەم

سەفەرەمان نییە

هەناسەکانم هێندە مەحزونە

ناسکی پەنجەرەکەی تۆ بەرگەی ناگرێت" ..

دایکە .. ئیدی تەزبیحەکەت لەسەر دڵم دادەنێم

تا دوایین ترپەکانی دڵم بژمێرێت ..

هاوڕێکەم لە دوایین تەئویلی خەونەکانیدا وتی:

"گەر سەرینەکەم هێندە زبر نەبووایە

نیازم بوو بۆ خەوێك

لە ژێر ساباتە پوچەکانی نیشتماندا ڕابکشێم" ..

ئاخر هاوڕێ ببورە



وەرزێک لە تەنیایی

پیاسەی ژێر ئەم بارانە هێندە سانا نیە

با بیر لە مەرگێکی دیکە بکەینەوە ..

ئەوەتا هەموو میحرابەکان ڕوخاون

گەر نزاکانمان گیرا بوونایە

ئیدی گریانەکانیشمان بێمانا دەبوو ..

خەیاڵێکی چەند شوومە ئەم بەهارەت دەشێوێنێ

سەفەرێکی چەند بێدەنگە

کەس لەم مردنەت ناگات ..

با ئەم ئێوارەیە گۆرانییەکی دیکەیش بڵێین

تا خەونێکی دیکەمان نەدیوە

تا تەئویلێکی دیکەیان لێ وون نەکردوین

تا وون بووەیەکی دیکەیش نەگەڕاوەتەوە ..

گەر تیشکی ئەم چرایە نەبووایە

باوکم وڕکی لە گەڕانەوەی هاورێکەم نەدەگرت ..

کۆلانەکەمان بۆنی غەریبیی گرتووەو

خوا بەخێری بگێڕێت ئەم تورەیییەمان

دار هەنارەکانی نیشتمان بەری بێ هودەیی دەگرن

ئەمشەو بەدیار تاریکییەوە دادەنیشمو

دلۆپی هەموو ئەو "باران"ە

دەژمێرم کە نابارێت ..

لە ژێر پیاسەی هەورێکدا بە شێك لە پێکەنینەکانمان

جێدەهێڵین



وەرزێک لە تەنیایی

ئێوەو نیشتیمانیش

بە خەیاڵی عەجولیمان دەسپێرین ..

بەرلەوەی مردن بێتو گۆرانیەکی دیکەمان بۆ بڵێت.

٢٠٠٧/٣/٢٧

**بۆ هاوڕێم (عومەر سەیدە) پێشکەشە**

مۆری ئەم دووروویيە
لەنێو چاوانمان نابێتەوە
ئێرە بەبێدەنگی نیوەڕۆیەك بسپێرە ..
خۆ ئەگەر ئاسمانێ هەیە لای تۆ
بایی سەد باڵ فڕینت دەدەمێ ..
خاكو خۆڵی ئەم نیشتمانەیش
لەزاكیرەی هاوڕێیەتیماندا هەڵدەگرم ..
بەڵام گۆڕی دایكت بەكێ دەسپێری؟!!
غەریبی نیوەڕۆیەكی وڵاتو



وەرزێک لە تەنیایی

خەوی بەر تریفەی ئەستێرەیەكو
سەرینی ڕەقی شۆستەیەك
دەدەیت بەكێ؟
هاوڕێم ..
من ئولفەتم بەم تەنیاییەوە گرتووە
بۆیە هەموو ڕۆژێك بێدەنگی
دەمكات بەمایستڕۆی ئەم كۆرسی غەمەو
ئیعازی ژەنینی نۆتەكانی گریان دەدەم
تۆیش غەریبییت شاد ..
دەستم لەكێلی ئەم گۆڕە نابێتەوەو
داوای دێڕێك لەوەسیەتەكانی باوكمی لێدەكەم ..

تۆیش بێدەنگ بنو ئەزیزم

نیشتمان لەوە بێدەرگاتر نابێت ..!!

ئاوی هەموو بارانەکان

بەرێتر نابن لەدڵۆپێ فرمێسك

بۆ شۆردنەوەی کێلی گۆڕە بێکەسەکەی دایکت ..

بەڵام هەر سەفەرت شاد ..

پەنجەرەی ئەم مردنەشم لێدامەخە

ژیان قوفڵی دەرگاکەم دەشکێنێت ..

دڵتەنگ مەبە بەم قەدەرە

خۆ دەبوو ئەم جەنگەیش بدۆڕێنم

کلیلی هەموو سەرکەوتنەکانیان لێسەندین ..



وەرزێک لە تەنیایی

چوونەوە گیرفانە دڕاوەکەی باپیرم ..

ئیدی تفەنگەکانیشم ناردەوە

بۆ بەردەرگای منداڵیم

تا غوسڵی توڕەییان دەرکەن ..

لەم عەزابی گەورەبوونە ..

ئێستا ئاسەواری هەموو ئەو خاچانەش

کۆ دەکەمەوە

کە هەموو ڕۆژێك

هەزار جار لەئامێزیان دەگرتم ..

ئاخر من نەمدەزانی

خەمی تۆ گەڕانە بۆ چرایەك

دەتەوێت خەونەکانی عاتیفەی لەبەردا تەئویل بکەیت

تا دەنگی پێکەنینەکانی من کاست نەکات ..

کەچی ژیان

بایی شەوێك ڕوناکیت پێ نابەخشێت

بێدەنگ بنوو

تا گوێت لە درۆکانی ئێرە نەبێت ..

پیاوەکانی ئێرە گیرفانەکانیان هەموو دڕاون

بایی هەڵگرتنی حەرفێك ئارامی شك نابەن ..

بۆیە من هەموو ئەو نامانە

دەدەمە دەست ڕەشەبایەك

کەلێیان نووسرابوو





" ماڵئاوا شار لانەی خەمم ..

کێ دەزانێ دێمەوە لات"..

دوایین دێڕی ئەم چیرۆکەیشت بۆ دەنووسم ..

تا لێرە منداڵانی شار ئەز بەری بکەن ..

"دەڕۆم" ..

ئەمە دوایین دێڕی ئەو پەپولەیە بوو

کەبەمەحزونی بەشاری وت:

"ماڵ .. ئاوا" من دەڕۆمو

بست بەبستی ئەم نیشتمانە

بەئێوە دەسپێرم ..

٢٠٠٦/٣/٢

عومرێکە

بە دیار تارمایی تەرمی شەوێکەوە دانیشتووم

کەتیایدا ڕەنگی عەزیزانمان لیَ ونبوو ..

چاوەڕێی پێناسەیەکی ئەوم

تا بیکەمە دەروازەی چیرۆکی بوون ..

هەموو جار لە ورشە ورشی

ئەستێرەو مانگ ڕادەمێنم ..

تا وتەیەکم پیَ ببەخشن

بیکەم بەسوکنایی بۆ ئەم کۆچی دووڕوویيە ..

ئای هاوڕێم .. لە بێکەسی گەورەییمدا

بۆ بەرائەتی مندالّیم دەگریم





لە قومارێکدا لەگەلّ پیریيدا دۆڕاندم ..

کە هەنارەکانی گەورەییم پیَ قوت نادرێت

ژەهرەکانی مندالّیشم پیَ هەلّنایەتەوە ..

چیمە لەم هەڕاجخانەی عومرە ..

کە هەموو شەویَ

سیناریۆی دابڕانێکی دیکەمانەو

مالّی ئاشنایەتیشمان لیَ ونبووە ..

کە ئەدوێم تەنها زمانێك شك دەبەم

ئەویش زمانی مندالّێکە گەر بمداتی ..

کە دەڕۆم تەنها دوو پێی ماندوو

ئەوانیش بێزارن لێم

لە گەڵما نایەن بۆ گەڕان ..

ئێستا چاویشم لە هەڵبڕین دەترسێ

نەبا یەکجار ببینێ و ئەویش تۆ نەبیت ..

ئاخر هاوڕێم ..

عەسرەکانی یەکدی ناسینیشمان لێ یاساغە

چ جای بەیانیانەکانی ئاشنابوون بەگوڵ ..

لێیان سەندین ڕوانینەکانمان بۆ باڵای شار ..

بۆیە بێدەنگ بێدەنگ

تنۆک تنۆک

فرمێسك بۆ وونکردنی ڕەنگی ئەزیزانمان دەڕێژین

کەناشزانین لەکوێ ونمان کردن ..





کەس ڕێناباتەوە سەر نیشتمانی بەرائەت

هەموو لاڵی دەربڕینی گڕوگاڵەکانی منداڵین

بۆیە ڕەنگە قۆقزەکانی گەورەییمان گرتووە ..

ئای لە گێلی ئەو ئێوارەیەمان

بەدزی خۆرەوە

پیلانی مەرگمان بۆ مانگ دادەنا

چەند نەفام بووین نەماندەزانی

کە شەو ئێمە دەکوژێت ..

دەروازەکانی ڕاکردنمان لێدادەخات

هەموو کوچەیەکی ئەم نیشتمانەمان دەبێتە

هەڕاجخانەی فرۆشتنی (ڕۆح)

ئەوسا ئیدی (خۆر) قاقا پێمان پێدەکەنێ ..
ئێستا لە بوونی خۆم
ڕادەمێنم و بە شوێن خۆمدا دەگەڕێم
کەس نەما بۆ دۆزینەوەی خۆم
پرسیاری لێنەکەم ..
یەك پرسیارم هەیە .. تەنها یەك وەڵامم دەدەنێ !
(تۆ) لەبەینی کاغەزێکی دڕاوا
دەمێکە لە ئەرشیفی ماڵێکی وندا
بۆت دەگەڕێن ..
بەڵام کەسێك نییە بتدۆزێتەوە
ئاخ دایکە





ئێستا من بەم ڕوحە شەکەتەی خۆمەوە
ڕوحێکی شەکەت
شەکەتتر لە سیمای ئەو پەپولانەی
بە شوێن پێی دەزگیرانەکانیاندا
کونج بە کونج و بست بەبست
کۆڵانەکانی شار تەی دەکەن ..
بە حەسرەتەوە لە ڕێبوارەکانی دەپرسن
داخۆ ماڵێك هەبێت تەنیاییمان بگرێتە باوەش؟
یا ئەدرەسێکمان بدەنێ
بمانباتەوە مەملەکەتەکانی خلود ..
لێرە بێزارین

ئەوەندە وانەی تەنیاییتان پێمان وتەوە ..
لە سیمای مەرگ بەولاوە
هیچی دیکەمان پێ ناخوێندرێتەوە
هێندە باسی دابڕانتان بۆمانکرد
گوێمان تەفسیری یەك دێڕی پێیە
"ئێوارەت پیرۆز تەنیاییت شاد" ..
بۆیە لە دۆزینەوەی خۆیشم وەڕس بووم ..
ئاخ دایکە تۆ ئەزانی؟
هەموو ڕۆژێك لەو بیابانەوە لمێك دێ‌و
شوێن پێیەکانم دادەپۆشێ !!
تامەزرۆی بەیانییەکی ئاشنابوونتم ..



وەرزێک لە تەنیایی

کەچی ئێوارەیەك فەرمووی مانەوەم لێناکەیت
لەچاوەڕوانی ئەودا
ڕوحم بوو بە بەشێك لەبیابانو
تنۆكێك باران هەر نەباری بەسەریدا ..
زمانم بوو بە پێنووس
بەڵام یەك وشەیشی پێ نەنووسرا ..
هەر دوو پێم بوون بە گۆچان
بەڵام کوێرێك نایگرێت بە دەستێوە !
دە دایکە گیان ..
بەس شێر و خەت لەگەڵ
قەدەری گەورەبوونی مندا بکە

دڵنیا بە (حەرفێ)ك هەڵوەری جارێكی دیكە

نایەتەوە ناو دێڕی هیچێك لە شیعرەكانم ..

من ئەو حەرفەم كە هەڵوەریوم ..

بۆیە ئێستا وەكو مانگێكی غەریب..

بە ئاسمانی ژیانەوە

هیچ دەریایەك تریفەم ناگرێتە ئامێز ..

كوچەیەكی ڕوخاوی سەرەڕێمو

نەورەسێك لە پاڵما ئۆخژن ناگرێ !!!

با سەد ئاسمان هەبێت لای تۆ ..

ئاخر من باڵم نییە بۆ فڕین ..

بەسیە گەورەبوون





بەسیە وون كردنی خۆتان و

خۆمان و ئەوان ..

نا .. من دایكێكم دەوێ

ئەم منداڵە گرینۆكەی ڕوحم ئاشت بكاتەوە

شاد بكاتەوە

بەجۆلانەو بووكە شوشەكەی خۆی ..

كە منداڵێكی عەجول

لە كاتی چاوشاركێدا لێی دزیبوو ..

دوێنێ دڵم لە دوا دێڕیدا

بە حونجە نوسیبووی

"لەمنداڵیمدا گەورەییم دۆڕاند

لە گەورەییمدا چاوشارکێ

لەگەڵ نیوەی خۆمدا دەکەم !!

لە ترسی شارگڕی هاوڕێکانمان

پشت دەکەینە (شار)

نەبا بەدزییەوە جارێ

شارگڕێ لەنهێنی دڵی

ئەم منداڵە ماندووەی من بکەن و

لەگڕوگاڵی ئەو پێکەنینەی بکەن

لەوڕێنەکانی گەڕانەوەی تۆدا دەیانکرد ..

لە دوا دێڕدا (ببورە) !

بە حونجە بنووسن



وەرزێک لە تەنیایی

بە سادەیی پێبکەنە

با لەم خەونە بە ئاگا نەیەن

تا بۆ ساتێ ئاسودە بژین ..

**٢٠٠٥/٦/٢٩**

**هەموو ساڵێك**

**ئەم قەسیدەیە خەلاتی دووەمی سێهەمین فێستیڤاڵی لاوانی پێبەخشرا ساڵی ٢٠٠٦ لە سلێمانی**

هەموو ئێوارەیەك

لەگەڵ بێدەنگی ئەودا

بەسەر گەڵای وەریوی ئەم خەونانەمدا

توند توند دەستی نامۆیم دەگرم و

پیاسەیەك بەسەر درۆكانی ئەواندا دەكەین ..

چەند بێدەنگ بەشوێن مەرگی خۆماندا

ورد ورد دەگەڕێین

قەدەری مەرگ وایە

دەچینە سەرەتای هەر كۆڵانێك

منداڵیمان لێدەسێننو

لەو سەریش گەورەیی لەخاچمان دەدات ..





تادەممان وشك وشك دەبێت

تف لەتووڕەیی ئەو ڕەشەبایە دەكەین

كە دەمێكە چاوی گرتومو

نایەڵێ ڕێبەرمەوە بۆ ماڵی هاورێكەم ..

لەترسی تاریكی شەو هەموو بەیانییەك

دەستی تاڵێك لەپرچی خۆر دەگرمو

لەنێو ڕوحی خۆمدا

چرایەكی پێدادەگیرسێنم ..

دەچمەوە گۆڕستانەكەی ئەو بەرمانو

باوەش بەكێلی گۆڕێكدا دەكەم

كە پڕە لە پێكەنینەكانی من ..

دەمێکە وادەی دیدارێکم بەمەرگ داوە

ئەوەندە بێ ئەدرەسم نامدۆزێتەوە ..

ئەوەندە فاتیحام بۆ ئەم ڕوحەی خۆم نارد

تا مردووەکانی ئەوێش لێم وەڕس بوون ..

هاوار لەدەست سەرمای ئەم شەوی وڵات

من وەك گەڵایەکی وەریوی دەم ڕەشەبام و

ئەو هەڕەشەی مەرگم لێدەکات ..

دەست دەگرم بەدامێنی شارەوە

تکای داڵدەدانی ئەم شەومی لێدەکەم ..

چەند دڵڕەقە ئەو

گوێی لەم هەموو هاوارەی من نییە ..





دەڵێی دوایین بڕیارەو داوێتی ..

کە دیاری ئەو

بەخشینی تەرمی منە بەگۆڕستان ..

خشپەی مردن دێت لە بن میچی ژوورەکەمدا

پێدەچێت فریای سەفەرێك نەکەوم

بۆ ئەو دیوی نیشتمان

لەسەر باڵی ئەم تەنیاییە بێمە خوارێ ..

خودایە ..

خودایە .. بەس ئەم ئێوارەیە ئەو(با)یە ڕابگرە

کەلە توڕەیی خۆت دەچێت ..

ئەها شوشەی پەنجەرەکەم هەڵوەریوە

ئەم سایەقەیە پەنجەی لە گۆ خستووم ..

بیناییم دایە دەستی ئەم تاریکییە

تەنها چرایەك و ژوورێکی بێدەرگا شك دەبەم ..





بەرگەی توڕەیی ئەو(با)یە ناگرن خودایە ..

ڕەشەبا مانای بەخشندەیی نازانێت

خودایە کەمێ میهرت ببەخشە پێی

تەنها زەمەنی نووسینەوەی دوو دێڕ

بەڕوخسەتی میهرەبانیت ..

ئیدی باوەش بەتاریکیدا دەکەمەوە

تا تەنیایی لەئامێزیدا دەمخەوێنێت ..

دەبا ئەم ئێوارەیە ئەو هەورە جێمان بهێڵێت

دەرگایەك بەڕوی ئەو خۆرەدا بکەرەوە

تینم بەرێ

دەستم بۆ دوایین ماڵئاوایی لە نیشتمان هەڵبڕم ..

خۆ هێشتا قەڵەمەکەم پڕە لەحیبری سەوز

کەچی بۆنی باروت حەوشەکەی تەنیوم ..

خودایە ..

باخچەیەکم بەرێ دوور لەنیشتمان

سەرینێکم بەرێ لەمیهرەبانی دایکم بچێت ..

بێهودەیی میوانی هەمیشەیی ماڵەکەمە

حاڵیم بکە لەم نهێنییە

لە سیحری تورەیی ئەو هاوڕێیانەی

کە سیمای سەرپۆشەکەی دایکم پێ بەخشیبوون

پڕم کەرەوە لە دڵنیایی

گومان لە بەرائەتی خۆشم دەکەم ..



وەرزێک لە تەنیایی

عومرێکە تابوتێك لەسەر شانمەو

تەرمی (با)یەکم تیادا هەڵگرتووە ..

ئەگەر گوڵێك نەشێوێنم ..

گۆڕێك شك نابەم تیایدا بشارمەوە

بستێك زەویم بەرێ

ئارامی تیایدا پاشایەکی سەرشێت بێت ..

دەستنوێژی سەفەرێکی قوڵم هەڵگرتووە

عیشق دێتو دەڵێت:

بەر لە ڕۆیشتنت دوو ڕکات نوێژم لە پاڵدا بکە ..

لە حیکمەتی ئەم شێتییەش ناگەیت

ئێوارەکانت دابەشی چەند بکەیت

ئێوارەیەکت لە ئێستا مەحزونتر نابێت ..

تا تۆ لەبەرزی (چیا) بڕوانیت

بەنیازی گزنگی بەیانییەکت مەبە خۆر لێت توڕە

نەبێت ..

وەرە ئەی شەو

دوعای شیعرێکم دەتگرێت

بۆ وێردەکانی سەفەرم پێ لەبەر دەکەیت ..

ئێوارەیەکم نەماوە بۆ گەڕانەوە

نمایشی ئەم هەموو جەنگە چییە

لەچاومدا هەڕاجی دەکەیت ..

وەسێتی ئەم هەموو مردنە جێمەهێڵە لام





دڵم لەتۆ ناسکترە

چاوەڕوانی ڕۆیشتنی (وەفا)م

بەبەر دەگاکانی ئێوەدا

بێدەنگ وەرن

تەنیاییم لەو سەری کۆڵان چاوەڕوانتانە ..

" ئاه ..

ئای .. تۆ مەعشوقێکی چەند دۆڕاوی

کە هێشتا کۆڵانەکانی فیردەوس

پڕە لە تامی پرتەقاڵی ژیان

کەچی ئولفەتت بەپیاسەی

کۆڵانەکانی دۆزەخەوە گرتووە" ..

ئەمە نووسراوی سەر یەکەم تابلۆی بێدەنگیم بوو

لەبەرگی دووەمی کتێبی سەفەردا

بەیانییەکی وەڕس لەچاوەڕوانی نووسیبووی

" دەترسم ئێوارەیەك وونبم لێتان

ئەو کاتەی تەنیایی لێرە سەری خۆی هەڵدەگرێو

ئاوێنەکەی ئەوبەریشمان تەم گرتبێتیو

ڕەنگی شێواوی کەسمان نەناسێتەوە ..

میوانداریی ئەو هەموو گوڵەم پێناکرێت

پێدەچێت ئەم شەو پایز لێرەبێت

مەمبەنەوە بۆ ئەوێ ..

بۆ ئەو ژورەی ڕەشەبای توڕەییەکانی باوکم





منداڵیمی تیادا شێواند

فرمێسکی هیچ لەعەشیقەکانیش

سەبوری گەڕانەوەی نادەن ..

چونکە مردن لەسەر جێگەکەی منو دایکم خەوی

لێدەکەوێت

ئەو کاتەی ئێمە بۆ لەتێك لە سوکنایی

لەبەردەمی پەنجەرەکەیدا وەستاوین ..

لە گەڵ یەکەمین زەنگی (کڵێسایەك)دا

فەتوای مردنمان لەبەردەم چرایەکی تەڵخدا بۆ

دەخوێننەوە

ئێمەیش بۆ گەیشتن بە مشتێك لەجوانی




بیر لە مەرگێکی نارنجی دەکەینەوەو

وەسێتەکانی دوایین ئێوارەی بەر لەسەفەر

لەسەر مێزی چۆڵترین ژووری شاردا جێدەهێڵین ..

٢٠٠٦/٦/٢٥





دوایین وەسێتی نیشتمانمان دۆڕاند

ئێستا دایکم میهرەبانترین پادشای ئەم خەیاڵەیە

ئەرێ هاوڕێ ..

کەی بەکفنێکی سورەوە دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ

خۆ ئێمە لە باوەشی چاوەڕوانیدا خەو بینایی بردین

وەرەوە .. ژیان هێندە بەبەها نییە

تا نەتوانین پێشوازی تۆی پێ بکەین

ئەلف‌و بێی ئەم هەموو جەنگەمان تەواو کرد

ئێستا وانەی (چوارەم)مان ماوە

بۆ ئەم  ئیمتیحانە قورسەی تەنیایی ..

بێ تۆ ناتوانین سەعی تیا بکەین





ڕەنگی عەرعەر ڕژایە چاومانەوە

ئەوەنەدە لە بیابانمان ڕوانی

کەچی قەسیدەیەکی

ونبوونمان بۆ نەنووسرا ..

تۆ ئەو هەموو چرایەت لە غەریبیدا سوتاند

کەچی ئێستا لەبەر تاریکی ئەم نیشتمانە

جورئەتی سلاوێکمان نەماوە لەتۆ ..

بیرت دێ دایکم بەر لە مردنی هەردووکمان

دەیوت: پشت نەوی مەکە ڕۆڵە

من دەمێکە جورئەتی گەڕانەوەم نەماوە

من ڕۆژی دە جار بەنزیك ماڵەکەی تۆدا دێم‌و

بۆن بە هەناسەكانی باوكتەوە دەكەم

هەموو شەوێك خەونێكی ئاڵ دەبینمو

كەسیش تەئویلی خەمێكمی پێناكرێت

ئەی وەسێتی عاتیفەكانت لە كوێن؟

من دەزانم ژیان ئەوەندە بەرز نیە

بەڵام ڕێگەی نیشتمانمان ون كردووە ئەزیزم

گریانم بۆ پێكەنیەكانی تۆ دێت ..

ئێمە پێمان نا بەسەر ئەم هەموو بزمارەدا

كەچی هێشتا سوڵتان ناوی دەزگیرانەكانمان نازانێ ..

دەكرێ ئەدرەسێكی دیكەمان بدەیتێ

ئەو ماڵەمان بۆ نادۆزرێتەوە



وەرزێک لە تەنیایی

كە تۆ لەبیاباندا بۆت دەڕوانی

خۆ ئێرە هەر تەنیاییە

كام تابلۆ لە ڕەنگی تۆ دەچێت؟!

تۆ تەماشای ئەم تاریكیەت پێ دەكرێت؟!

خۆ هیچ چرایەك

جورئەتی سوتانی نەماوە

چی لەم هەموو تەرمە بكەین

ئەدرەسی هەرچی گۆڕپچكە هەبوو ونمان كرد ..

وەرەوە بەسەر تەنیاییەكانماندا

فاتیحایەكی دیكە بخوێنە

بێ تۆ كەس ناتوانێ دەرگای نیشتمان ڕاموسێت ..

ئێمە نازانین عومری غەریبی چەند دەخایەنێت

وەرە جانتاکەت پڕ بکە لە چاوەڕوانیەکانی ئێمە

ئەوەتا ئێمەو مردن

چاوشارکێ لە گەڵ شەرمدا دەکەین ..

شەرم ..

دەستگیرانە عەیارەکەی هەردووکمان بوو ..

ئاخر لەم نیشتمانە تەنیایەدا

بیرەوەرییەکانی منداڵیش دەدۆڕێنین

خەونەکانمان هیچ .. هەر هیچ نەبوون ..

ئەرێ هاورێ کەی بە کفنێکی سورەوە دەگەڕێیتەوە

ئەم ماڵە؟!!





کەس جورئەتی نییە ئەو دەرگایە دابخات

پەنجەرەکان هەمیشە لەسەر پشتن

گوێ بۆ چرپەی پێیەکانت هەڵدەخەین ..

هەموو ئێوارەیەك

بە دیار گریانەکانی نیشتمانەوە

پیرۆزیی جەنگێکی دیکە دەدۆڕێنین ..

هەموو جەنگێك

خەونێکمان دەبات

هەموو خەونێك

تەئویلی جەنگێکی دیکەمان بۆ دەکات

وەرەوە هاورێ ..

تا شەکەتی لە پێیەکانمان نەچۆڕاوە

با پیاسەیەکی دیکەی نیشتمان بکەین

پیاسەیەکی ئەبەدی

بە تەنیشت ئینجانەکانی

فیردەوسدا دەکەین ..

ئاخر نیشتمان

بەشی گۆڕێك لە جەستەی خۆی

نادات بە ئێمە

ئیدی چی لەم هەموو

حوزنی تەنیاییە بکەین ..

دەبگەڕێوە بۆ نیشتمان هاوڕێ ..